# دیوانی صافی



چاپی سێیەمین

٢٥٨٢ی کوردی - ١٩٧٣ی زایینی

«چاپخانەی کوردستان»

هەولیر

# پێشەکی

صافی لەهەرێمی هەولێر لەناو دۆستە هەرە دڵسۆزو ئەمەگدارەکانیدا یەکەمین کەسێك بوو کەبەدیداری وی پەردەی خەفەت و بێزارەم لەسەر دڵی لادەچوو چونکوو ڕووی لەهەر شوێنێکی کردبایە لەبەر شەپۆلی زمانی شیرینی و ڕووی خۆشی و ڕاوێژی دڵپاکانەی وی کەهەر لەو دەمەوە شاوە لەشکری تارمایی نەگبەتی و خەم و دڵتەنگیەتی لەو ناوەدا بەپشت شکاوی دەڕەویەوە.

صافی کەدەهاتە شاری هەولێر لەماڵی بەهەشتی حاجی عبداللەی کەبابچی میوانداری دەکرا، وەبۆ دیدەنیش لەوانەی کەبەندە شارەزایان بم زۆرترین کات هاتوو چۆی لای خوا لێ خۆشبوو شیخ عبدالقادر قەدری بوو یێژی کوردی کەرکوکی و لای بەندەو کاك حەوتی یوسفی دەکرد.

هەرچەندە لەسەردەمی خۆیدا بەسەرهاتی ( صافی )و زۆرترینی هەڵبەستە دەست نووسەکانی خۆیم هەر لەخۆی وەرگرتووە، بێجگە لەوانەش هەر وەکوو لەناو بەسەرهاتەکەیدا دەخرێتە بەرچاوانەوە تەنها بەندە بووم کەتوانی بێتم وێنەیەکی باشی وی وەرگرم چونکوو ئاینداریکی پاك و خوادا ناسێکی ڕاست بوو حەزی لەخۆ دەرخستن و نلوبانگ نەدەکردو نەیدەهێشت وێنەی وەربگیرێت بەندەش لەدوای کۆچی وی هەر چاوەڕێی هەلێکی وا بووم کە کوڕە خوو و ڕەوشت پاکەکانی ئارەزووی چاپکردنی دیوانی باوکیان بکەن سا لەسەر ئەرکی خۆیان یاخی من، کەچی لەپڕێکا لە ١٩٥٣ دا مامۆستا محسن دزەیی دیوانەکەی صافی لەسەر ئەرکی خۆی بەچاپ گەیاندووە بەسەرهاتەکەشی بەپێنووسی مامۆستا علاءالدین سجادی نووسراوەتەوە.

لەو دوواییەیدا حاجی کاك مەلا عەلی کە کوڕی هەرە گەورە و پوست
نشینی بەهەشتی ( صافی )یە دیوانی ناوبراوی پێشکەش بەچاپخانەی ئێمە کرد
بۆ ئەوەی دووبارە چاپ کرێتەوە ، هەر جوورە چەوتیەکی لەچاپەکانی پێشودا
ڕووی دابێ هەڵەبژێری کراوە وەچەند پارچە هەڵبەستێکی کەلەناو ئـەوی
پێشوودا نەبوو خراونەتە ســەری و بەسەرهاتەکەشی گەلێك هەڵـگێڕو
وەرگێڕو دەستکاری کراوە .

بەندەش سەرڕای ئەوەی کەبەسەرهاتەکەیم هەر لەخۆی وەرگرتووە
شارەزاییێکی شیاویشم بەسەر هەموو چەشنەبارێکی ژیانی وی دا هەیــە
خودا یار بێ لەوانەیش کەلەبیرم ماون چەند مەبەستێکی دەخەمە بەر چـاوی
خوێندەوارە بەڕێزەکانەوە تا باشتر پەی بە بەرزیەتی پایەو دڵپـاکیەتی
و مەردی و ڕەندایەتی صافی ببەن وەچەند پارچە هـۆنراوێکیش کە بـە
دەستنووسی خۆیم هەیە وەلەناو دیوانەکەیدا نـەبوو دەیانخەمە شووێنی
خۆیانەوە .

گیوی موکریانی

# بەسەرهاتی صافی

هۆنەری پایە بەرزو رووێژی ناوداری خۆشناو ئێوی ( کاك مصطفی کوڕی کاك حەولا « ثانی » کوڕی کاك علی کوڕی کاك عەولای کوڕی کاك مصطفی کوڕی شیخ سلیمانی‌یەو نازناویشی صافی‌یە .

ئەو خانەوادەیە لەبنەچەکەدا ( میر مەحەلین )و بەشەش پشتان دەچنەوە سەر شیخ سلیمانی باپیرە گەورەیان کە بەمیری سۆران ناوبانگی دەرکردبوو ، وەفەرمانڕەوای گوندەکانی ناوچەی هیران بووە ، بەلام دەوواییدا شیخ سلیمان بەهۆی شیخ طاهای بتلیسی‌یەوە گرفتاری زنجیری ڕێ و شوێنی قادری بووە ئیتر بەجارێکی وازی لەمیرایەتی هێناو دیوانی میریەتی بەتەکیە گۆڕیەوە وەرووی لەدەرگای خودا پەرستیی و پارێزکارێتی کرد داب و دەزگای خودا ناسینی لەسەردەمی ویەوە تا ئەمرۆ لەناو ئەو خانەوادەیەیدا هەر لەباوە .

صافی لەگوندی ( هیران* )ی دا لەبەرواری ( ۱۸۷۳ )ی زایینی‌دا پێی ناوەتە کۆڕی ژیانەوە ، لەسەرەتاییدا لەلای باوکی خۆی دەخوێند لەپاشان چووە ناو فەقێیانەوە ، بەرە بەرە بەناو خوێندنگەکانی ناو خۆشناوەتی‌دا گەڕاوە ڕووی لەکۆیەو هەولێرو ڕەوانەدزێش کردووە وانەی لەلای مەلا ئەحمەدی هۆمەر گونبەتی و مەلا ئەحمەدی رەش خوێندوە ئەوجار سەرێکیشی لەلاجانی داوەو ماوەیەکیش لەپەسوێ ماوەتەوە

---

(*) هیرانو نازەنین : دوو گوندی بەناوبانگ و ئاوو دیمەن خۆش و پڕ باخ و رەزو مێرگ و گوڵ و گوڵزارن دەڵێی پارچەیەک لەبەهەشتێکن کەوتونەتە ناو هەرێمی خۆشناوەتی‌یەوە .

ئینجا لەوێش ڕا ڕوو لەسابلاخ دەکات وەچەند ساڵێکی لەمزگەوتی ( شا دەروێشی ) لەلای قاضی علی باوکی ( قاضی محمد ) دەخوێنی لەو ماوەیەدا پلەی خوێندەواریی خۆی لەزمانی ئارەبی و فارسیشدا زۆر بەرز بکاتەوە .

هۆی بوورێژیی صـــافی :

صافی هەروەکوو لەخۆیم بیستووە لەتەمەنی چاردە ساڵیەوە دەستی بـە هەڵبەست هۆنینەوە کردوە ، هەرچەندە لەو تەمەنەدا شۆڕو سەوداو ئـەڤینی گوڵەندامان دوور نیـە ئەویان وەکوو بولبول خستبێتە چەهچەهەو ناڵە ناڵ وەخۆش و ناخۆش بەناچاری کەوتبێتە نێو باوەشی دڵدارێتی و سـەوداوە ، بۆ سوور کردنەوەی ئەو مەبەسە هۆزراوە تەڕو ئاودارەکانی گرنگ تـرین بەڵگەن بەڵام سەرڕای ئەوەش پێویستە ئەمانەش لەبیر نەچنەوە کەدیمەنـە خۆرسکەکانی ( هیران و نازەنین ) بەتایبەتی ئاوی شیرین و ڕەوانزو هەوای فێنک و بووژینەوەی باخ و باخچەو ڕەزە دڵگرەکانی و گوڵزارو چیمەنە جوان و ڕەنگینەکانی کەلەتوانای مندا نیە بڵێم وەبەهەشتی دەچن چونکوو شایانی کەبەهەشت وەوان بچووێنرێ . سا ئەو هەرێمو مەڵبەندە دڵکێشە نـاو نازدارانە بەو هەموو شانو شکۆیەیانەوە نەك تەنها صافیان کردۆتە بولبولێکی شەیدای ئەو ناوچەیەو بەس بەڵکوو شۆڕی ئەڤین و سەودای ئەڤینی بەئەـ ندازەیەکی ئەوتۆ لەناو خانەوادەی واندا کاریگەر بووە جـۆش و خرۆشـی سەوداو هەوەسی هەڵبەست هۆنینەوەو وێژە پەروەری لەناو دڵ و دەروونی ئانی باوکی و زۆرترینی کوڕەکانیدا وەکوو جیلوەی هەتاو ئەندامی نواندووە .

زۆرتریی هەڵبەستەکانی ( صافی ) بەسەر دوو بڕاندا دابەش دەکرێن ( ئایینی و دڵداریتی ) . هەرچەندە زۆریشم هەوڵ لەگەڵیدا کە بۆ یادگار پارچە هەڵبەستێکی نیشتمانیش بهێنمەوە داخەکەم بێ سوود بوو .

کاکی خۆشناو بەزمانی کوردی و فارسی و ئارەوی و تورکی هەڵبەستی زۆر داناوە بەڵام ئەوڕووی ئەوەوە کە کوردیەکانی لەوانی دی پترن شایانی سوپاسە .

پلەی صافی لە بەروێژیی‌دا :

هەڵبەستەکانی صافی هەرچەندە لەڕووی ڕەوانی و سوواری و پوختی و ئاوداری و ڕاوێژ شیرینی و بەتایبەتی لەلایەن ئێش و پاشبەندو هەموو بابەتێکەوە دڵگرو پەسند کراون هەر وەکوو بوو یێژی نیشتمان بەرومەری کوردی هەولێری بەهەشتی (کانی) و هۆنەری زاناو بەناوبانگ مفتی ( مەلا رەسولی بێتووشی ) لەناو هەڵبەستەکانیاندا بەدوور و درێژی هەڵیان ناوە وەپێیان هەڵکێشاوە داخەکەم لەم دەمەدا ئەهی هەریەکەی تاکێکم بەدەستەوە بەوە ئەگەر بهێنم لەچاپی نوێتری‌دا هەموویان دەخەمە بەر چاوانەوە کانی دەڵێ :

ئوستادی غەزەل صافی‌یە جێگەی لەمیرانە

مەدحی چ بکەم ظاهیرو مەشهووری جیهانە

---

ئەوا ئیمانی پێت هێناوە مەنفی  بەرموو مصطفای ئاخر زەمانم

بیرو باوەڕی بەندەش لەڕاست وایەوە ئەوەیە ئەگەر صافی هەروەکوو لەڕێگای ئاییندارێتی‌دا بەئەندازەیەکی ئەوتۆی خەڵوو سەخڵەت و شەوکەت کردووە تاگەیشتۆتە پایەی پیرانی خودا ناس ئەگەر بەقەد نیو هەندەی وی لەڕێگای وێژەش‌دا خۆی ماندو بکردابایە هیچ سوو ( شک ) لەوەدا نیە کە ئەتوانای‌دا هەبوو بگاتە بەرزترین پلەی هۆنەری لە کوردستانی‌دا .

( صافی ) هەرچەندە لەناو هەڵبەستەکانیدا زۆر لەمەی و ئارەق دوواوە کەتەنها لارووی بیستیاردوە بوو و نەیدیتبوون ، بەڵام زۆر ئارەزووشی دەکرد کەبەچاوی خۆشی جارێکی بیان بینێ . وا دەگێرنەوە کەرۆژێکی بەناو بەیێك لەشەقامەکانی موصڵیدا رادەبرد تووشی بەر دەرگای مەی خانەیەکی هات لەگەڵ هاورێیەکانی بەبێ یەکو دوو کردن دەچێتە ژوورێ و دادەنیشن مەی فرۆش دەڵێ مەللا چ دەخۆنەوە ؟ لەرووی ئەوەوە کە کاکی میرانی هیچ جۆرە مەیەکی نەدیتبوو و ناویشی نەدەزانین کوتی خۆت سەرپشك بە هەرچەکی بۆمان دێنی بێنە ، مەی فرۆشیش بەئارەزووی خۆی مەی پائارەقی لەپێش دانان ، کاکی دڵو دەروون پاك ماوەیەکی تەواوی تێراماو زۆریشی ئەسرین هەڵوەراندو پارەی مەیەکان تەواو دەدا بەمەی فرۆشەکەی کوت : ئێمە هێشتا نانمان نەخواردوە با ئەوانە هەر لێرە بمێننەوە تا دەچین نانی دەخۆین و دەگەرێینەوە ئیتر ئەوێ دەردەکەون .

( صافی ) تا کۆچی دوواییی بابی لەباری بێ پەرواییدا دەژیا جاری وا هەبوو بەهەڵبەستی هۆنراوە تەرو ئاوداری دڵداریێتیەوە بەسەر دەبرد هەندێ جاریش لەگژ راوی مەلو کێوییاندا بەدەشتو نەواڵو تۆسا راندا دەخولاوە ، رۆژگار تەنها سی ساڵ ماوەی ئەر ژیانە ئازادەی دایە ، بەڵام کەباوکی کۆچی دوواییی کرد ئەویش ناچار لەشوێنی وی دانیشت و تەواوی خێرو خۆشی گێتی بەرێو شوێنی دەروێشانەو پیشەی خودا پەرستیەتی گۆریەوە ، ئەویش گراو (عاشق)ی رێو شوێنی شێخ طاهای نەهری بەچەشنێك بوو تاوکەتە رێزەی خەرقە پۆشانەوە بەوەش تەواو

دڵی دانەکەوت دەستی گەیاندە زنجیرەی ئەڤینی دادگەرانەی شێخ عبدالقادر (غەوثی گەیلانی)و سالّێ چەند جارێکیش دەچووە دیدەنی بارەگا بەرزەکەی وەلەناو زۆر ترینی هەڵبەستەکانیشیدا بەندبوارێتی دڵە پاکەکەی وی لە راست بارەگای بەرزی گەیلانیدا بەگرنگی ئەندام دەنوێنی .

کاکی هەیرانی بەهۆی دڵپاکیتی و ڕوو خۆشی و ڕاوێژ شیرینی و دادپەرستیەتی خۆیەوە بەرزترین شوێنی لەناو دڵی دۆست و ئاشنایەکانیدا بەو دیاری کرابوو .

کاکی خۆشناوەتی لەپارێزگاری و خودا پەرستی بەدەر هەموو چتێکی بەهیچ دەزانی و سامانی هەموو گیتی لەلای پوشتێکی نەدەهێنا وەکەم و زۆر حەزی لەناو و ناوبانگ نەدەکرد کەلەهەموو تەمەنی خۆمدا پیاوێکی وا بە ڕەنگم کەم دیتووە . بۆ نموونە بالێرەدا سەربردەیەکی ویتان بۆ گێرمەوە :

لەڕووی ئەوەوە کەچەند پارچە هەڵبەست و بەسەرهاتەکەیم هەر لەخۆی وەرگرتبوو وەبۆ مێژووی وێژە ئاتاجی وێنەیەکیشی بووم هەرچەند کەتێوا نیشمان بێ ئەندازە خۆش بوو وە لەڕووی دڵسۆزێتیەوە زۆر جاریشی هاتو چۆی دەکردم چەند سالێکی تکام لێ کرد کەوێنەیەکی بۆ یادگار وەربگرم تەنها وەڵامی ئەوە بوو : تۆ خراپ لەمن گەیشتووی وە دەزانی کەمن پیاوێکی وام شایانم بخرێمە ناو مێژووی وێژەوە من خاکم و سبەینێش هەر دەبمەوە بە خاك ئابڕووی لەو هەموو بووێژە پایە بەرزانەی کورد بەمن و هەڵبەستە بێ سەرو پایەکانمەوە مەبە لەناو مێژووی وێژ کەتدا ئیتر لەمەولا ی چەند دۆستێکی کەهەبوو لەسەر داخوازی من هەموویان تکایان لێ کرد کەمەیدان

بدات وێنەیەکی وەربگیرێت . داخەکەم وەڵامی هەموویان هەر ئـەوە بوو کەمنی دابڕوە ، هـەرچەندە بەو بۆنەیەوە زۆریش دڵگیرو بەپەرۆشەوە بووم بەڵام دەرم نەبڕیو هەر چاوەڕێی هەل بووم لەو ماوەیەدا چـەند جارێکیش بەناوی گلەییەوە بەگوێی داماوی برام هەڵێنا بوو وە ئەویش دەیکوت هیچ کۆسپەیەك نیە لەگێتیدا کەمرۆی تێکۆشەر وسەری نەکەوی کەچی خواو راستان داماو ( حزنی ) برام لەکاتێکا هاتە دوکانێ کەصـاف و برای‌و چەند کوڕێکیشی لەوێ دانیشتبوون . چەندە دەمزانی کەصاف‌و کاکم دۆستایەتیان هەیە بەڵان نەمـدەزانی پایەی دۆستایەتیان تا چ رادەیەکیە چونکوو تائەو ڕۆژی هەردوو کیانم لەیەك شووێنیدا نەدیتبوون . کەسەیرم کردئەوەندە جـووت‌و لێك نزیکن چەندە لەنێوانیاندا وەکوو بێگانەیەکي نەناسراو وا بووم .

ئەوسا دووای چاك‌و خۆشی صاف لەلای کاکم دەستی بەگلەیی‌و گازاندە کردلەدەست من‌و کوتی : کاك سەید حەزانی گیو زۆرم سەخلەت‌و تـووڕە دەکات ! کاکم هەرچەندە لەمەبەس ئاگاداریش بوو بەڵام خـۆی ناشی کردو کوتی لەڕووی ئەومەوە کەگیو برای منە ناتوانی لەفەرمانی من دەرچێ تۆش بمکە سەرپشك تا بەئازادي کۆتایی بەو کارەساتە بدەم . صاف کوتي . جا تۆ بەبێ ئەوەش هەر برا گەورەي کەس لەفەرمانی تۆ سەرپێچی ناکات .

کاکم پرسی دە بفەرموو بزانم تاوانەکانی گیو چین ؟ کاك فەرمووی گیو لای وایە کەمن سووڤیەتی بووێژم پێی داگرتووەو زۆرم ڕوو لێ دەنێ کە وێنەم وەربگرێ هەرچەند پێی دەڵێم ( باوکم من خاکم‌و سبەو دووي دەبەوە

بەخاك شایانی ئەوە نیم كە تۆ لەناو مێژووی وێژەدا بمخەیتە ریزی بووێـژە هونەرمەندەكانی كوردەوە تكایە ئابرووی وان بەمنەوە مەبەو جگە لەوەش من حەز لەناوو ناوبانگ ناكەم سوودی نیەو وازم لێ ناهێنێ .

داماو گوتی : چۆن ناوانە گرنگە ناپەسندەكانی گیو هەر ئەوەیە ؟!

صافی ئەوەلامیدا گوتی بەڵێ هەر ئەوەیەو ناوانیش لەوە گەورەتر نابێ ! !

داماو گوتی كاكی بەرێز فەرمان بەسەر تۆدا بەو چەشنە درا كە ئێستا لەشوێنی خۆت هەستیو بچی لەسەر هۆو كورسیەی دانیشی بۆ ئـەوەی وێنەكەت وەربگیرێتـو رووی لەمنیش كردو گوتی لەبەرامبەر ئەو ناوانەدا كەزانی وەت كردووە دڵی كاكی نازدار بشكێنی سزات ئەوەیە هەر ئێستا وێنـەكەی وەربگری ناجارێكی تر دڵە نازدارەكەی سەغڵەت نەكەی .

صافی دەمو دەست وەكوو سەربازێكی گوێدێر لەشووێنی خۆی هەستاو چوو لەسەر كورسی ناوبراو دانیشتو بەندەش بەئارەزوو ی خۆم وێنەیەكی باشی كارەبایم وەرگرت ، كەهیچ كەسێكی تـــر نەیتووانیوە وێنەیەكی وا رەوشەنو باشی وی وەرگرێ .

ئەوجار كاكی هیرانی بەداماوی گوت : لام وایە دادگەر (حاكم)ێكی داد پەرست نەبووی لای برایەتیت بەهەند گرت وام زانیبا ئەمەدە كردبە بـرا گەورە بەلام دۆڕاندم !

داماو کونی کاکی خۆم چەندین ساڵە تاگام لەو گیرەو کێشەیە هەیە ڕاستیە.
کەی ئەوەیە تۆ هەرچەند خۆت بەخاك بزانی گیو تۆ بەڕێز دەزانی ئێستاش
کێشە لەنێوانی دا ئەما تـۆ حەز دەکەی خۆت هەر بەخاکو خۆڵ بژمێـرەو
گیویش لەکاتی خۆی دا بەپێی بیروباوەڕی خۆی لەتۆ دەدوێ .

صافی لەسەردەمی شێخێتی لەناو گێتی دا بەندبوارێتی خۆی لەڕاوو دەنگی
خۆش و جوانی خۆرسك بەدەر لەگەڵ هەمو خۆشی و ناخۆشێکی تر پساندبو

**صافی و ڕاو** : زۆرترینی سەردەمی خۆی بەڕاوی باڵندان و پەروەردە
کردنی کەوان بەسەر دەبرد وەلەناو گێتیدا هیچ جێێکی لەکەوی سـپی
خۆشتر نەدەویست .

صافی و جووانی خۆرسك : کاك بەدیتنی گوڵ و گوڵزارو دیمەنانی خـۆش و
جوانی خۆرسك وەکوو خونچەی دەپشکوت . هەرچەندە گوندی (هیران)
لەهەموو لایەکەوە لەبەهەشت خۆشتر بوو سەرڕای ئەوەش هێنای حەوزو
سەراوو چەند جۆگەیەکی لێ دامەزراندو خیزو ووردە بەردی زەردو سوری
لەخەندەرانەوە هێنابوو وەبەپێی سەلیقەی بەرزو پەسندەبەوە بەناو حـەوزو
سەراو و بەندو جۆگەلەکانیدا بەچەشنێکی نـەندازیاری دابەش کردبوون ،
ئەوجار دیمەنی هیران وێڕای باخ و باخچەو ڕەزو چیمەن و گوڵ و گوڵزارو
تریفەی ئاوو تروسکەی بەردە ڕەنگاو ڕەنگەکانی مرۆی سەرخۆش دەکرد .

صافی و دەنگی خۆش : کاك هەمیشە چەند دەروێشێکی دەنگخۆشی لەلا بوو
بەتایبەتی فەقێ خدرو دروێش مستەفاو حاجی عبداللّەی دەنەژن کەلەکۆڕی
دیوەخانەدا دەنگیان لێ هەڵدێنا باڵندانیان بەهەواوە دەوێستاند خۆبەتایبەتی

لەھەڵبەستە تەڕو ئاودارەکانی کاکیان دەخوێندەوە کاتیان بەجارێکی دەخرۆ شاندو بۆی دەھەژاوە وەکوو ڕێژنەی بارانە فرمێسکی بەسەر ڕوومەت و ڕیشیدا ھەڵدەوەراند . ھەر کاتێکی صافی بەتابەتە ھەولێرو دەشتی دزەیی و بازینووی شێخی و شوەیێنانی تر دوو مێ دەنگخۆشێکی بەژاردەی لەگەڵ خۆی دەگێرا بۆ نموونەی شەیدایی صافی لەپێناوی دەنگی خۆشیدا باسەر بردەیەکیان بۆ ھەڵڕێژم کەلەخۆی و کوڕەکانیشم بیستووە :

چەند جارێکی لەموصل و بەغدایە کەبەشەقام و کۆڵانەکاندا ڕابردووە لەکاتێکی کەدەنگێکی خۆشی مرۆڤ یا گرامافۆنی گوێ لێ بوبێ بەبێ ووزە ( اختیار ) لەوێ ڕاوەستاوە کەزۆر یشی کار لێ کردبایە بەکوڵ دەگریاو فرمێسکی ھەڵدەوەراند ساتەو شوێنە چاکبا یاخراپ رادەوەستا تاگۆرانیەکە کۆتایی دەھات

بۆ نموونەی دڵڕاگرتن و دۆستایەتی و ئەمەگداری و دڵفراوانی و سازانی صافی بەسەرھاتێکی تریشم وەبیر ھاتەوە جێگای خۆیەتی یادی نوێ کەمەوە :

ڕۆژێکی ئەمانگی ڕۆژووواندا کاکی دڵ، دەڕوون پاك لەگەڵ کاك نوری برای و چەند برادەرێکی تردا لەلای بەیدە دانیشتبوون لەپاش ماوەیەکی پێی کوتن ھەستن باچین دیدەنێکی عەونیش بکەین ئەوانیش وتیان قوربان کاك عەونی بەڕۆژو نیە بچینە لای وی چ بکەین ئێرە باشترە . کاك فەرموی دەك ماڵتان کاول بی بۆگێلی و نەزانیتان ئێمە دەچینە لای عەونی ئەگەر بەڕۆژو بوو ئێمەش پێی بن خۆ کەپێ نەبوو ئێمەش پێی نابین ، ئیتر چونە لای وی .

داخەکەم لەدووایی ئەمەنیدا چاوەکانی کزو کەم بینا بوون ، با بەکورتی بیبڕمەوە کاکی ھەـــیرانی کەوەکوو گوڵی گوڵاوی ھەموو شووێن و کۆڕو

هەر یمێکی دە کردە بەهەشتێکی خەملاو و بۆنخۆش وەیا هەم دەتکوت بولبولی سەوداسەری گوڵانە داخی گرانم ئەو گوڵە بۆنخۆشەو ئەو بولبولە سەرخۆشە لە( ١٩٤١ )دا پەڕو باڵی هەڵوەراندو ڕەوانی پاکی بە گیان ئافەرین ئەسپاردوە لە گوندی هیرانی لەئەشکەوتی ( شیخ سلیمانی )دا لەغارێکی داتاشراوو گۆڕستانی بنەماڵەی وانە لە گۆڕێکدا نێـژرا کەلەسەردەمی ژیانیدا بەدەستی خۆی بۆ خۆی هەڵکەندبوو .

بەڵێ ئەو دۆستە زاناو پایە بەرزەو ئـەو برادەرە دڵسۆزەشم بەفەرمانی چارەنوس بەناچاری بەجێی هێشتم ، ڕۆژگاری چەبگەڕ بەدوور خستنەوەی ئـەو بووێژە ناودارو ئەمەگدارو دڵـسۆزە داغێکی دیکەی وای بەجەرگەوە نام کەتا ماوم لەبیرم ناچێتەوە . بەهەشتی حەوت کوڕو چـوار کچی لەپاش بەجێماون ئەوا بەپێی تەمەن ناوی کوڕەکانی دەخرێنە پێش چاوانەوە : ـ

١ ـ حاجی کاك مەلا علی کە کوڕی هەرە گەورەو پۆستی نشینی خۆیەتی .

٢ ـ حاجی کاك مەلا عەزیز          ٣ ـ کاك ئـەنوەر

٤ ـ کاك جەعفەر          ٥ ـ کاك عبدالقادر ( غەونە )

٦ ـ کاك جنید          ٧ ـ کاك عبدالکریم ( بابە شێخ )

---

سەرنجێك لەوەی کەئەوە دیوان نیەو کەشکۆڵە : لەرووی ئەوەوە کەبێجگە لەصافی ( کاك ثانی ) باوکیو چەند کوڕێکیشی لەوێژەدا دەستەلاتدارن وام بە بەرژەوەندزانی کەلەلاپەڕە ( ٨٥ )ەوە چەندپارچە هەڵبەستێکی کاك (ثانی) باوکیو لەلاپەڕە (٨٨)دا چەند هۆنراوێکی ( صفوەت ) و لەلاپەڕە ( ٩٤ ) دا پارچە هەڵبەستێکی (سۆزی) ، وەلەلاپەڕە (٩٧)یشدا پارچـە هەڵبەستێکی (ووریا) بۆ یادگاری بنەماڵەی بەرزی هیرانیان چاپکرێ .

## « سوپاس »

لەرووی ئەوەوە کەکاك حاجی مەلا عەلی دیوانی خوا لێ خۆشبووی باوکی پێشکەش بەچاپخانەی کوردستان فەرموووەو کاك عبدالقادر غەوثەش (سۆزی) هەڵەبژێری کردووەو کاك عبدالکریمی بابەشێخیش سەرڕای هەڵەبژێری دیوانەکەشی نووسیوەتەوە لەکانگای دڵەوە دەسکەگوڵی بۆن خۆشی سوپاسیان پێشکەش دەکەم ٠

گیوی موکریانی

ووردە خاڵی ئێستەکەش نازیٚ لەسەر پەروین دەکا

چاوی نازی دائما بازی بەئاهووی چین دەکا

ڕۆژی جێژنە عادەتە دەستی حەنایی کا مەگەر

سا کەوابێ دیٚ بەخوێنم پەنجەکەی ڕەنگین دەکا

طیری دڵ لەم ناوە دەرناچێت و ئەو حەددی چیە

چونکە یارم بازێکە نەخچیری سەد شاهین دەکا

حەقی کوشتەی خۆی ئەدا ئەغیارو ئەما یاری من

قاتلێکە دەی کوژیٚ خوێنیشی لێ تضمین دەکا

گەر مەرامی کوشتنە یارم چ باکم سەر نیە

وا ئەسەف ئەما کەدامێنی بەمن خوێنین دەکا

زامی هیجران زۆر بەئێشە هەرکەسیٚ نەیدیتووە

بێت و بنواڕێ کە دڵ لەم دەردە چۆن ناڵین دەکا

(صافی) تۆی شادی بەئاوی چاو دەچێنێت و کەچی

چی بکا لەم طالعە خاشاکی خەم وا شین دەکا

***

یار لەبەر نازی جوانی مامزە سارەم دەکا

یا لەناڵەی عاشقانە ڕوو لەعالەم کەم دەکا

لەعلی لێوی شاهدە ملکی دڵم خاصی ئەوە

حەقیەتی بەو خاتەمە دەعوایی جامی جەم دەکا

ئاهی سینەی عاشقانە وا جیهانی گرتووە
لەو بزانە گەر دەماوەند بەعزە جارێ تەم دەکا
ڕووو خاڵی ڕەونەقی لالەو وەنەوشەی ساندووە
لالە داغدارە وەنەوشەش بۆیێ هەر ماتەم دەکا
من ئیجارەی خەرمەنی غەم بۆ دڵی مسکین دەکەم
سونی طالع دێت‌و هیجرانی لەبەر من زەم دەکا
دڵ ئەمە گدارەو کەچی مەحبوبە ئازاری دەدا
خەڵقی بۆ بێگانە وایە ئەو لەگەڵ محرەم دەکا
(صافیا) دڵ مائلی تەنهایی بێ عەیبی نیە
عیلەتی سەودایەتی هەر حەز لەجێی بێ غەم دەکا



دڵ لەبۆ مەحبوبە دیسان گریەوو زاری دەکا
وا لەهەردوو چاوەکانی خووێن‌و ئاو جاری دەکا
وا سەراسەر ڕووی زەمینی گرتووە خووێناوی ئەشك
دوودی ئاهیش ڕۆژی پۆشی‌و ئاسمان تاری دەکا
زۆر بەئازارە دڵی زارم لەبەر هیجرانی یار
ناحەقە ئەو عالەمە لەو زارە بێزاری دەکا
مەرحەبایێکم بکا بۆ دڵ فریبی منیەتی
وەرنێ ئەو بێ ڕەحمە کەی بۆ عاشقان یاری دەکا

ڕێی موسولمانی لەدڵ نیشت پەرچەمو ئەگریجەکەی
بۆیە ئێستێش وا بەیادی زولفی زناری دەکا
چاوەنۆڕی یارە بۆیە ڕێگە دەڕشێنی بەخوێن
عەیبی لێ مەگرە کەئەو بێچارە خوێن باری دەکا
قەت مەڵێن یار بێ وەفایە وا بەناحەق دەیکوژێ
بیکوژێ یا نەیکوژێ (صافی) فیدا کاری دەکا



دێ بولبول لەدەوری باخی گوڵ یاری نەکا چبکا؟
لەلای خونچە هەر دەم شیوەنو زاری نەکا چبکا؟

زەمانی لەزەتی ڕۆیو دەوری زیللەتی واهات
ئیتر یاران لەمەولا ڕوو لەدلداری نەکا چبکا؟
لەئاهی گەرمەوە وا لێو بەبارو هێشکە ئێستێکە
لەتانی چاوەکانی خوێنو ئاو جاری نەکا چبکا؟
شەوی هیجران خەیاڵی یار دەکا اصلا خەوی نایێ
بەیادی ڕۆژی وەصلی حەز لەبێداری نەکا چبکا
بەکفری زولفی ڕێی ئیسلامی بەستووە بۆیە دڵ ئێستێ
وەکو صنمانی دائم مەیلی زینناری نەکا چبکا؟

دڵم عەیبی نیە گەر ڕووی زەوی تەڕ کا بەخوێنی ئەشك
بەئاهی دوودناکیش ئاسمان تاری نەکا چبکا؟
لەلایێ فیرقەتی یارو لەسووێ میحنەتی ئەغیار
لەهەر دوو لا دڵی مسکین رجا کاری نەکا چبکا
هەوای یاری لەسەر دەرناچێ اصلا لەو جەفای دووری
دڵی بێچارەکەم هەردەم وەفاداری نەکا چبکا
ئەگەرچی بێ وەفا یارم جەفای‌دا ئەو دڵی مسکین
وەکوو (صافی) لە بەد بەختی فیداکاری نەکا چبکا



ئەوا غەزوی غەمی بۆ غارەتی دڵ کردە یەلغارە
وەکوو هەیهاوی عارەب سا عشیرو عێلە هاوارە
مەڵێن دڵ بێ هەوارو ترسەنۆکە یا بەتالان چی
لەلای خۆیشی عەگیدو خانەدانو پێکە سالارە

ئەما چبکا لەگەڵ بەختی ڕەش‌و ئەو چەرخی کەچ ڕەفتار
کەسەر عەسکەر بەدائم بۆ سوپای غەم فرقەتی یارە

هەزاران قوشەنی غەم بێ بەبێ سەر عەسکەری یارم
دڵی دێوانە هەڵنایێ ئەگەر بیکەن بەسەد پارە

وەلێ بێچارەیە ئێمڕۆ حیمایەی لازمە بۆیان
ئەوەك عالەم بلێ عێلو عەشیرەت بوونە بێ كارە

لەوەختی ئێمەدا ئێستەش بەعەیبو عارە وا یاران
خصوص لەم وەختەدا چونكی لەچەند جێوە برینداره

وەفای عالەم ئەما غیرەت خەلاص بوو ( صافی ) ئێستێكە
بەناقە سووارە دڵ چبكا كەجێشی غەم بەملیارە



دڵ لەبەر دەردی فیراقی یارە مەیلی مەی دەكا
گریەی لەدەنگی سازو عودو بەزمی نایو نەی دەكا

سەردەمێ مەستو خومارو خادمی مەیخانەیە
وەختێ تەسبیحی لەدەستە سۆفیە حەیحەی دەكا

ڕۆژی وایە زۆر بەكەیفو پێكەنینو خەندەیە
باعزێ شەو مەجنونە دائیم گریە بۆ لەیلی دەكا

بەعزێ جاران عالمو عامیلو عابد خۆبەتی
وەقتی جەهلو فیسق زۆرە عالەمێ لۆمەی دەكا

پێی دەڵێم ئەی دڵ وەرە تەیرانی یاتورانیبە
تاو لەبەینی هەردوو جێگا ڕوو لەدەشتی ڕەی دەكا

دڵ نزانم شێتە یا سەرخۆشە یا دێوانەیە ؟
یا الاهی ئیشی وا عکسی بەمن تاکەی دەکا ؟
دوور لەیارە دڵ لەبۆیێ بێ ئبانە ( صانیــــا )
تاکوو لەو سەگ مەرگەدا بێ ئیختیاری وەی دەکا



چاوەکەم چاوم بەدائم ئینتظاری تۆ دەکا
شەو بەیادی عارضت یادی گوڵی شەوبۆ دەکا
راحەتی هەڵگرت لەعالەم وا لەمەهدی سینەکەم
طفلی دڵ بۆدایەیی وصلت وەها رۆ رۆ دەکا
چونکە بۆی نەینا سەبا گەردێ لەژێری نعلەکەت
دڵ لەتاوا خاکی گشت عالەم بەسەر ڕووی خۆ دەکا
قەترەیی ئاوی نەمەکبارت بنێرە ئەی طبیب
وا ئەزامی سینە بێ مەرهەم چ صفتو سۆ دەکا
وادیی عیشقت ئەوەند دوورە بەرۆژ تەی ناکرێ
پەیکی دڵ بۆیی سکون نابێ بەئەو شەو ڕۆ دەکا
ئاوری عیشقت دەروونی وا سەراسەر گرتووم
دوودی ئاهم وا لەسەر چەرخی بەرین بۆن سۆ دەکا
جەیشی هیجرانت بەجارێ مولکی جسمی گرتووم
بۆیێ ( صــافی ) لەم زەمانە لەشکری غەم کۆ دەکا

گوڵناری ڕوخت ڕەشکی بەگوڵزاری ئیرەم دا
دوو تاقی برۆت طعنی لەمحرابی حەرەم دا

روح مەستە لەراحی تۆ لەنێو عالەمی ئەرواح
باتن لە ( بەلێ ) دایەو زاهیر لە ( نعم ) دا

هاسناوی کەهەستاوە قیامەت بەقیامەت
ڕێیەوی کەڕۆییوە دەمم لەو دەم و دەمدا

دڵ وا لەبەر ئازاری وەکوو نقطەی زارت
گاهێ لەوجودا هەیەو گاهێ لە عەدەم دا

بۆچی نەگری دڵ لەسەر ئەم شێوە پەشێوە
وا حەپسە لەنێو چینی چەی پەرچەمی چەم دا

گەر بێتو بەسەرخۆشی بپرسی لەنەخۆشیم
حەق القدمە روح لە قەدەمگاهی قەدەم دا

( صافی ) لەبەر ئەم خاڵەیە خالی لە ( خەیاڵە )
یا کێی بەزۆر دایە ومیا زۆری بەکەم دا

---

ئەگەرچی دڵ بەڕۆژی عارضت سووت
بەلێ وا عادەتە بۆ عاشق ڕووت

نیە احتیـاجی پابەندیم بەقوربان
کە گیراوم بەداوی تاری گیسووت

بە ناری عیشقەوە مەمنێژە جانا
دەسووتێنی بە باڵڵە کەفن و تابووت

بە غەمزەی تـۆ بڕینی مـن هەزارە
موژەت بەسیە لەگەڵ ئەبرۆت مـەکە جووت

بە کوفری زولفەکەت دڵ وەرمەگێڕە
کەوا سالیکە لەبۆ میحرابی ئەبرۆت

بەخەنجەر چـارەیی دڵ ناکـری وا
گرفتـارە بەسیحری چاوی جادووت

بەسەر سەودا دەکا (صافی) بەرِووی تۆ
مبـانی پێچی پەرچەم خاڵی هیندووت



بازی دووری وا بەتیری غەم دڵی کردم نەزار
قەت مەمێنێکم نەبوو عەرزم بیاتە کۆیی یار

دەردی دووری بەو طبیبانە عیلاجی ناکرێ
زامی تقدیری ئەزەل بادارووی لوقمان چکار

ئاوری هیجران لەسینەم دابی کفنم بۆ چیە
خۆی لەبەر ئەم نالە ناگریٚ سەنگی تابووت و مەزار
ئەی رەفیقان عیللەتی دووریمە دەستم لیٚ مەدەن
قەت شفای نابە برینم تا نەگاتە دەستی یار
ئاوقی عاشق ویم لەگەردندا نەجاتیم بۆ نیە
کۆششی بێ فایدەیە یادی خەلاصی رستگار
من گەدایی کۆی نیگارم پادشاهیم کەی دەویٚ
دەولەتی دونیاو قیامەت بۆ چمە بێ چاوی یار
عالەمت بیٚزارە لیٚ ( صافی ) لەبەر زاری بەسە
مەقسەدت تفویض بکە بۆ خالقی پەروەردگار



ئەی بایی سەبا هەستە لەحالم بەوە هوشیار
شرحی دڵی مانەم زەدەکەی من بەرە بۆ یار
لەو فرقەتی ئەو وا رەمەقی ماوە لەعومرم
ئومیٚدی حەیاتم نیە رووحم نەبیٚ غەمخوار
تاجیلفە درشدی شوغریب گوگلەی هەیهات
وعلنلە نەجات پولەسەبی چـــارە کیمی وار

کیسه صوره مزعیلله‌ی عشاقنه هه‌ر گیز
تیماره سنن بعشقه‌ی یوق زومره‌یی بیمار

لا أمنـــع عن قربك من لومة لائم
ان أصبر فی بعدك قـد احـــرق بالنـار

لو جسمی بعید الك فالروح قـــریب
ان ترحم بالروح وإن تقتل فاختار

مه‌ن مه‌سته‌م ئه‌زان باده‌یی صهبـای تو لاکین
این سیری تو در جلوه‌گه‌ی عشقی تـو هوشیار

کاشانه‌یی لاهوت بوه‌د لایق آنکس
مالو سه‌رو جانش کی نهاده به‌ره‌ی یار

خۆی کوردی‌یه ( صافی ) له‌هه‌وای عیشقی تۆ ئێستێ
کوردی ، عه‌ره‌بی ، فارسی‌و تورکی بـــووه ئه‌شعـار



(( م ))

که‌ڕۆژی وصلی ئاوا بوو به‌چاو گریان نه‌که‌م چبکه‌م
شه‌وی هیجرانی وا داهات که‌دڵ بریان نه‌که‌م چبکه‌م
به‌کینه‌ی من دزوباره چه‌رخی کمج واکه‌ج مه‌داری کرد
منی بێ طالیش به‌و نه‌وعه گه‌ر دموران نه‌که‌م چبکه‌م؟

بەبێ یارم حەیات تەڵخو ئەجەل شیرینە ئێستاکە

لەبۆ ئاگەر روحی شیرینی خۆم قوربان نەکەم چبکەم

وەکوو دەوری فەلەک دایم یار نەبم یاران

فەرامۆشیم بەکێ دێ دڵ کەسەرگەردان نەکەم چبکەم

ئەگەر دەرمان نەکا بیماریی دڵ بێ وەفا یارم

لەدەردی بێ دەوا گەر چاو ڕێی لوقان نەکەم چبکەم

وەکوو یوسف لەزیندانی غەما حەپسی عەزیزێکم

لەبۆ تەسکینی جاریٚ ڕوو لەلای کەنعان نەکەم چبکەم

طبیب نەیتو دەوای دەردت نەدا چارم نیە ( صافی )

بەمردن گەر عیلاجی دەردی بێ دەرمان نەکەم چبکەم

---

تۆ دەزانی بۆچی یادی دڵبەری ڕەعنا دەکەم

مەیلی بەد ناوییە بۆ بێ کاری بێ پەروا دەکەم

سەر لەسەر سەودای تۆو دڵ لەپایی پێیەکەت

بۆچە جانا سەرو دڵ هەردوویان ڕیسوا دەکەم

موڵکی میسرم بۆچیە گەر ماهی کەنعانم هەبێ

چم لەبازاڕی زولەیخا یوسفی سەودا دەکەم

چاوەکەم چاوم لەبۆ چاوی تـۆ خووێن باری دەکا
وا منیش هەر لحظە بۆ تۆ شین و واوەیلا دەکەم

مەیلی من هەر مەستیو رەنـدیو شـاهید بازی‌یە
وا لەبەر میحرابی ئەبرۆت تاعەتو تەقوا دەکەم

من لەدەست دونیایی دونو عالەمی وا بەد عمل
ڕووی شکواو تەواضع بـۆ شەهی بەغـدا دەکەم

( صافیا ) هیران وەکوو نیرانە جیرانی جەحیم
سا کەوا بێتـو توکل دائمـا بەخـودا دەکەم



یاری خۆم لێ زیزە بۆیە حەز لەمەرگی ئەو دەکەم
شەو کە بێ هۆشم لەناوی وا مـسـەزانە خەو دەکەم

بۆ شکاری مورغی وەحشی ئەك هـەلۆو شاهینم
عەشقی چاوی بازی خۆمم بۆیە ڕاوی کەو دەکەم

ڕۆژ بەیادی ڕووی هەتا هێوارە هەر هاوارمە
شەو بەفیکری زولفی تا سبحەینێ سوحبەت لەو دەکەم

لەو دلارامە بپرســـن وا دلێ ئارامی نەمـا
جارێکی ،چارێکی دەردم کا دەخالەت بەو دەکەم

گوێم لەسازو عودو نەی چاوم لەساقی و بادەیە

خادمی پیری موغانم بۆیە وا پەیڕەو دەکەم

دەرفەو سوودی نەقدی دڵ لەو عالەمە بێ مایەیە

تابەکەی بێ فایدە سەرف گەنجی کەیخوسرەو دەکەم

( عافیا ) کافیمە بۆ دونیاو قیامەت یاری خۆم

چم لەباسی عالەمە هەر ذکری ناوی ئەو دەکەم

◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆◆

دلبەری ناز پەروەری ڕوو نەنوەری مەهپارەکەم

نەونیهال ، ئەبرۆ هیلال ، شیرین جمال ، نازدارەکەم

مەهرویی ، مشکین مویی ، چاو ئاهویی سحرای ختەن

سوور گوڵە ، موو سونبولە ، ماهی پەری ڕوخسارەکەم

جانی جانان ، شاهی خووبان ، ڕەهزەنی پیرو جەوان

گوڵ ڕووە ، شیرینخووە ، شۆخی شەکەر گوفتارەکەم

- چاوی کاڵە ، لێوی ئاڵە ، ڕوو بەخاڵە ، دڵبەرم

زولفی خاوە ، لێم بەداوە ، یارەکەی ئەغیارەکەم

چەندی بێ مەیلم دەکەی سەد هێندە مفتونم لەبۆت

جۆری ڕەحمێکت نەبوو دەرحەق دڵی خەمبارەکەم

بەسیە بێ رەحمی بەقوربان پایەماڵی خەم بووم
ڕێی نەجاتیم بۆ نیە گەر تۆ نەبی خەمخوارەکەم
ئەشکی چاوم ئەرزی داگرت دوودی ئاهم ئاسمان
بۆیە وا ڕەش داگەڕا لەو ئاهی ئاتەشبارەکەم
وا لەجێی تێشی خەدەنگت تا بەڕۆژی حەشر دوە
خووێنی لێ دەڕژێ بەدائم لەو دڵی زامدارەکەم
(صافیا) ساحال پەرێشانیم لەغایەت دەرچووە
رووحەکەم رەحمێ بکە بەو شینو گریەو زارەکەم



لەبەر مەیلی مەیی عیشقی تووە یاری وفادارم
لەتەکیەو خانەقا دەرچووم، خەریکی دێرو زیننارم
لەبەد کرداری من ڕوو وەرمەگێرە ئەی شەهی خوبان
کەتۆ ڕوو وەربگێڕی کەس نیە گەر بێتە خەمخوارم
لەدووریت لەنەی من پایەماڵی زیللەتە هەردەم
حەیاتم بێ جەماڵی تۆ سەماتی ژینە ئەی یارم
ئەگەر شەمعی جەمالی تۆم نەبێ ڕۆژم شەوی تارە
بینایی نووری چاوانم ئەتۆی مەهی ضیادارم

ئەوەندەم عجزو شادی ، وصل و هیجران دیوە ئەی یاران
لەرۆژی حەشردا اصلا نەحاجەت جەنەتو نارم
لەصفحەی عیشقەوە گەر صبرڕی رەحمت بێتە نێو عالەم
هەتا مەحشەر چکەس سجدێکی ناکا شاهی ( غفار )م
لەجیلوەی نورو اثباتی تۆ وەك ( صاف ) بەرۆژو شەو
دەمێ بێ هۆش و سەرمەستم دەمێ بێدارو هوشیارم



حەقیقم گەر فەلەك یاران بەئاهی دڵ بسووتێنم
جەواژە گەر زەمین یەکسەر بەخوێنی دیدە بڕشێنم
لەدەستی غەم جوانیم ڕۆیەو پیری ڕوو بەرووم وا هات
لەمەولا چۆن مودارا بێتو ئایا چۆن ئەبێ ژینم
لەعەشقی لەیلەکەی بێ مەیلەکەو دونیایی دوون هەیهات
سەرێکی ڕاحەتیم ساتێ نەبوو داێمە بالینم
لەدەردی دڵ لەجەرگی کوڵ لەداخی سینەکەی سووتاو
بەرۆژم دادو ڕۆ ڕۆیە لەشەودا شیوەنو شینم
بڵێنە شۆخەکەم بێ ڕەحمی تاچەند؟ بێ وەفا تاکەی؟
بەساتی خونچە دڵتەنگ بم وەکو گوڵ جامە بدڕێنم

بە ڕیشی سپیەوە یاری نەکردم بەختی ڕەش جاریٚ
منیش بۆیە کەعادەت عاجزیی‌و ڕەسەە ماڵینم
لەزاری من مەکەن بێزار ( صاف ) زۆر بەئازارم
لەداخی سینەکەی سووتاومە ئەو ئاخە هەڵـدێنم



حەبیبا خوٚت ئەزانی بوٚ لەعالەم بێ موبالاتم
لەطفلی سینە ڕیش‌و دلٚ بەئێش‌و سەر بەسەر سەوداتم
زیانی من لەعەشقی تۆ مەزانە غیرەتی خوٚمە
سبب وابوو بەمنداڵی لەدەردی عـەشقی ڕاهاتم
لەحاڵی نەوجەوانی‌دا جوانی توٚم موسەللەم بوو
لەمەولا چوٚن بەلایێ ڕوو بکەم شەیدایی بالاٚتم
دەمێکە بەندی چینی پەرچەم‌و پێچاوی کاکوٚڵم
بەدائم زارو خـەستەو دەست بەستەی زولفی تاتاتم
سەری خاڵی لەسەوداکەت چلوٚن سەودا ئەکەم جانا
سەری بازاڕی ئەغیارم نیـە موحتاجی کالاٚتم
سەراپا گەر هەمووم عـەیبە لەجاهی تۆ چ کەم نابێ
ئەگەر ڕەحمێ بکەی چونکی غەریبی زێری دەرگاتم

گەدا زادەی تووە (صافی) حەقی ئازادی‌یە قوربان
خەلاتم گەر سیاسەت بی بەمەمنونی ئەوا هاتم



لەناوی دەردی دووری تابەکەی بێ شیوەنو ئام؟
مودارا چۆن بکەم لەم حاڵەدا بەم عومری کۆتام
لەئەم ژینە گەلێ بێزارو لەم مانە پەشیمانم
بەبێ ڕەحمەت لەدونیاو ئاخیرەت لام وایە گومڕام
سەرای دڵ ئێستە تاریکە بەبێ شەمعی جەمالی تۆ
سەنارەی تالعم نەحسە نیقابت لادە ئەی ماهم
چیە حوکمی سلیمان حشمەتو جەم جاهی ئەسکەندەر
بەبێ فەرمانی تۆ ئەم ڕوتبەیە بۆ چیمە ئەی شاهم
گەدایی تۆم گەلێ بۆ خۆشترە لەو مەسنەدی شاهی
ئەبەندەم کافیە قوربان کەعەبدی زێری دەرگاهم
لەسیلەی ڕەحمە گەر قاصد بەتحفێکی سەلامت بێ
لەژێر پێی قاصیدت جانا بەسەر خاکی قدەمگاهم
ئەگەر جارێکی تر فەرمووی سەگی دەرگای منە (صافی)
هەتا مەحشەر بەسە بۆ من مقامی عیزەتو جاهم

## ( بەستە )

بەقامەت خەرامان بەڕوو ماهی تابان

فیدای تۆم گەدای تۆم عەزیزم

دەمێ بێرە لامان بنۆڕە غولامان

بەچاوی باز بەغەمزەو ناز عەزیزم

لەدەردت حەزینم کولاوە برینم

بکە دەرمان ئەتۆی لوقمان عەزیزم

لەبەر چاوی کالت لەعیشقی جەمالت

دەمێ شەیدام دەمێ ڕیسوام عەزیزم

لەدوو لا کوژاوم سەراپا سووتاوم

بەناری ڕووت بەدوو ئەبرۆت عەزیزم

تو شاهی جیهانی تو رووحی ڕەوانی

حەیاتم تۆی نەجاتم تۆی عەزیزم

وەکوو (صافی) هیران فیدای شاهی گەیلان

منی مەفتوون منی مەحزوون عەزیزم

( سالی ) لەدەردی فیرقەتە چارەیی حاڵی زەحمەتە

زامی بەئێش و ئەزیەتە دڵ بەبرین و ئێش و ژان (*)

جانا لەفیراق تۆ بەشێواوە دڵی من

پەروانەیی شەمعی تووە سووتاوە دڵی من

سەر تابەقەدەم غەرقەیی خوێناوە دڵی من

وەحشی صفەتە بەستەیی تێو داوە دڵی من

دڵ ئەلبەسەیی خووێنی هەموو دەم کە لەبەردا

دەیزانی فەلەک کینەیی وی مابوو لەسەر دا

چەند عاشقی کوژتوونەو خووێنی بەهەدەر دا

لەم تالی بەرگەشتەیە چۆن ماوە دڵی من

دائم کەلەدەست جەوری زەمانە بەجەفایە

پەیوەستە بەجەورو ئەلەم و دەردو بەلایە

بۆ عاشقی بێچارەیە ئەو عادەتە وایە

بۆیێ کەلە گۆشەی غەمی داماوە دڵی من

---

(*) سالی ئەو شیوەنەی بەبۆنەی کۆچی دوایی کوڕە نازدارەکەی ( لعلی ) بۆ یادگار هەڵبەستووە کەوا لەتەمەنی ( ۹ ) ساڵیدا جووانە مەرگ بووە .

ئاپووری بەلاوە لەدوو لا هاتووە یاران
بۆ قەتلی سەری عاشق و مسکین و هەزاران
معلومە کەدەر ناچێ لەبەر تیری سواران
چەند دەفعە لەدەم قازوخیان داوە دڵی من

سەر قافڵەچی دەستی منت دامەنە قوربان
مازۆ بەعجل مەحمەلی لەیلا بەهەموو ئان
مەجنون صفتان ماون و لەم رێگە پەرێشان
بێ چارە لە یارانی بەجێ ماوە دڵی من

دائم لەهەوایی تۆ گەلێ حاڵی پەشێوە
هەردەم لەجەفایی تووە وا کەوتووە جێوە
ئەو قورە بەسەرە روحی گەیشتە سەری لێوە
دەرمانی بکە تاکوو نەفەوتاوە دڵی من

ئەی بای سەبا قاصدی جانانی روح ئەفزا
نامەی غەم و دەردو ئەلەمم تۆ بەرە بەغدا
تا چەند لەئەو محنەتە دابی سەگی دەرگا
موددێکە وەکوو ( صافی ) کەشێواوە دڵی من

موودیکە لەهیجرانی تـۆ شـێوایە دڵی من
سەرگەشتەو بێچـارەو ڕیـسوایە دڵی مـن
پەیوەسـتە لەکێوانو لەسەحرایە دڵی مـن
مەجنون صفەت مائلی لەیلابـە دڵی مـن

ئـەم وەحشیە اصلا کە لەبۆ نێمە نەبوو ڕام
هەرچەندە سەعیو کۆشش ئەکەم نایەتە نێو دام
ئایا لەسەر ئەم شۆڕشەیە چی ئەبێ ئـەنجام
ئاثاری کەلەم وەحشـەتە پەیدایە دڵی مـن

سـەودازەدەو دێوانەو حـەیرانە هەموو دەم
بۆ یارو بۆ ئەغیار شەریکە لەهەموو غـەم
فارغ نەبوو یەك لحظە ئەگەر زۆرو ئەگەر کەم
ئاشوفتەو پڕ شۆڕشو غـەوغایە دڵی مـن

دائم لەغەمی عـەشقی تۆ وا خانە خـەرابە
بەو ئاوری دووریـە کەوا سینە کەبابە
بێمـارە مەگەر بۆیە کە ئازاری صـەوابـە
بەد بەختی نەبێ چی لەچ دامایـە دڵی مـن

بەو زولفە ئەسیری مەکە دێوانەیی تۆیە
مەسجونی مەکە خادمی دەرگانەی تۆیە
مەفتوونی جەمالی تووە پەروانەی تۆیە
موشتاقی قەدو قامەتی رەعنایە دڵی من

دووری لەوەتەن دەربەدەری یارو دیارە
بێ مونس و بێ یاوەرو بێ زارو نەزارە
بێمارو بریندارو جەفاکێشو هەژارە
بێ چارەیە وا رووبی لە بەلایە دڵی من

بێ رەحمو وەفایی بەسە ئەی یاری وەفادار
شەیدایی هەوایی تووە ئەو ( صافی )ی بێچار
پابەندی دووسەد غەم بووە لەو لۆمەیی ئەغیار
جێی چارەسەری دەرگەهی بەغدایە دڵی من

جانا لە غـەمت والەو حـەیرانە دڵی من
سەرگەشتە وەکوو وەحشی لە کێوانە دڵی من
دائم لەدەرو دەشتو بیـابانە دڵی من
موشتاقی وصالی روخی جانانە دڵی من

مەعلومە سیای پەرچەمە وا بەختی سیا کرد
زیننـاری دوو زولفە کە لەدینی تـەوەلا کرد
لۆمـەی مـەکە گەر رِوویی لەتاق کلیسا کرد
بۆ رِەمزی وەفـا شێوەیی سـەنمانە دڵی من

ئاسوودەمو فارغ نەبوو اصـلا لەغەمی تـۆ
قەت حەرفی وەفای جاریێ نەزانی لەدەمی تۆ
چونکی سەری خۆی ناوەتە ژێری قەدەمی تۆ
بۆیە وەکوو زولفی تۆ پەرێشانە دڵی من

پەروانە صفەت کەوتووە سـووتاوی چراغـە
وەك لالە لەعەشقی تۆ دەروونی هەموو داغـە
موددێکە لەهیجرانی تـۆ بێمـارو نەسـاغە
بۆیـە هەموو دەم تـالبی لوقمانە دڵی من

بۆ غارەتی مڵکی دڵی عوشـــاقە دیارە
تـــابووری غەمی کۆیە زیاتر لە هەزارە
تەسلیمی قەزا لازمە یاران نیـە چارە
چونکی لەسەر ئەم جەمعە قومانلانە دڵی من

دڵ کەوتە خەیاڵات لەبەر خونچەیی لێوی
وەك نوقتەیی مەوهومە ئەگەر بێ نەبزێوی
بەو فکرە لە باخی سەمەن و سونبول و سێوی
وەك بولبولی بێچـارە غەزەلخوانە دڵی مـن

عەبدێکی وەفادارو جەفاکێشە لەهیجران
وا کەوتووە وەك (صافی) لەدەرگانەیی گەیلان
بـەم دەردە سەرە کوژتنی لازم نیـە قوربان
لەم جەژنەیی قوربانە کەقوربانـە دڵی مـن

## مـن و دڵ(*)

من و دڵ ئیمڕۆ ئەو شۆخە لە خۆشی یەك بەدەی کردین
لە جامی لەعلی سەرخۆش و مـوقیمی مەیکەدەی کردین
هەتا مەحشەر خومارو مـەستی نازو نەشئەکەی کردین
بەغەمزەی چاوی مەخوری سیاهی مەستی مـەی کردین
بەمـاچی لێوی مستغنی لە ئەنواعی مـەزەی کردین

بەئەو یارە بڵێن یاران چی بە سووچ و گوناهی مـن
نەسیم ئەنگوت و شەو ڕۆیی چەمەن والا بوو ماهی من
چ قەوماوە مەگەر قوربان کەوا بەستووتە ڕاهی مـن
نزازا بەندی سوخمـەی ئاڵی گوڵناری بەئاهی مـن
کەچی دەستی لەسـەر دانا لەسەیری باخی بەی کردین

لەبۆ یەك مەرحەبایێ چـوومە لای یارم بەسەرخۆشی
نیقـابی خستە ڕوخـارو بەجارێ کەوتە خـامۆشـی
کە و م دی ڕۆیی نـارامی دڵ و صـەبرو فەرامۆشـی

---

(*) سێ تاکەکانی پێشەوەی هی ( صافی )یە ، تاکی چوارەم هی ( ناری )یەو تاکی پێنجەمینیش هی ( طاهر بەگی )یە .

بە هەوری پەرچەمو زولفی ڕوخو ئەبرۆی کەداپۆشی
لەشەوقی رونیەتی بـەدری هیلالی یەک شەوەی کردین

ڕەفیقانم کەسێ عاشق نەبێ لەم سبرڕە نازانی
لەلایێ یار حەیات بەخشو لەلایێ قابضی جانی
لەهەر دوو لاوە تەسلیمم بلێن دەستم بەدامانی

ئەگەرچی کوشتنی خۆ قابض الارواحی موژگانی
بەقانوونی مەسیحایی بەخەندەی لێوی حەی کردین

لەبۆ خوێن ڕێژی عوشاقان نیگارم گەرچی بێ باکە
وەلێ ئەی دڵ لەڕووی ئومێدەوە جلرێ تەماشا کە
مەڵێ (صافی) زەمان ئاخربوو کەس ئیمدادی کەس ناکا

دەوایی دەردی دڵ ( ناري ) لە ( تاهیربەگ ) تەمنا کە
بڵێ ئیمڕۆ گوڵندامی بەتیرێ جەرگی پەی کردین

## « چوار خشتەکی » (*)

وەرنە تەماشا دۆستو أحبان
ئەو بێ رەحمەي دیم لەموحبان
حەبەری دەردم چەندا طبیبان
دەرمانیان نەکرد زامي غەریبان

بولبول کە دائم نەشینو زارە
حەقیە کەغونچەی لەدەست ئەغیارە
ئەو گوڵ هەموو دەم هەر لەلای خارە
بۆ شەرم ناکا لە هەنەلیبان ؟

بۆیێ لەلای یار من هاوارم کرد
ڕازی دڵی خۆم پاك اظهارم کرد
دەردەکەی پەنهان عەرزی یارم کرد
چونکی وون نابێ دەرد لەطبیبان

---

(*) صافی ئەم هەڵبەستەی لەدیوانی حافظەوە کردووە بەکوردی وەلەخۆشیەوە خستوویەتە سەری و کردوویەتە چوار خشتەکي ٠

خوابە شادی بێ بەس بێ غەمگینی
بۆ دڵی موشتاق هەر تۆ موعینی
یارەب ئەو جارەش بیکەی بیبینی
چاوی موحیبان ڕوویی حەبیبان

قوربان با بەس بێ أوقاتی فصلت
لە ڕێگەی خودا بۆ کانی ئەصلت
ئەی شاهی خووبان لەخووانی وصلت
تا کەی هەر من بم لەبێ نصیبان

ئەی دڵ لەم شۆرە قەت نەبووی شەیدا
گەر مەیلت کردبا وەلایی بەغدا
(صافی)ش وەك حافظ کەی دەبوو ڕیسوا
ئەگەر گوێی دابا پەندی ئەدیبان

غونچەیی نەو بەهاری گوڵ دەرچوو لەدەستی باخەوان

بولبولی دەردەداری دڵ زاری گەیشتە ئاسمان

بایی خەزانە دەنگ ئەدا گوڵ کەبەزەردی ڕەنگ ئەدا

واوەلە سەر لەسەنگی ئەدا خونچە لەباغدا نەمان

ئەی دڵی بێ قەرارەکەم کەوتە هەوایی یارەکەم

سەبری لەکێوە چارەکەم زەحمەتە دەردی وا گران

دەوری فەلەك بەحیلە بوو فەصلی بەهاری بردو چوو

ڕەنگی خەزانی دامە ڕوو جوملە بەلایی خستە جان

دووریی یاری خونچە دەم خستیە سەر دڵم ئەلەم

وا ئەمسەفا لەدەوری خەم دەردی فیراق ئەدا نیشان

هەجرو فیراق دڵبەرم داویە لەسینە خەنجەرم

شەکوە بەلایی کێ بەرم ڕوو لەچلاکەم الامان

یادی وەفایی کێ بکەم مەیلی هەوایی کێ بکەم

چارە لەلایی کێ بکەم غەیری خودایی موستەعان

ئەی فەلەکا خەتام نیە کینەیی تۆ لەمن چیە

زولمی وا کەس نەکردیە دەرهەقی من لە إنس و جان

( عاقی ) لەدەردی فیرقەتە چارەیی حالی زەحمەتە

زامی بەئێش و ئەزیەتە دڵ بەبرین و ئێش و ژان

« و »

حەبیبا دڵ گەلێ بێمارە بێ تۆ
لەبەر دووری لە ڕووح بێزارە بێ تۆ

فەرامۆشی نیە بەو خەڵقە ئێستێ
لەلای نەقشێکی ڕووی دیوارە بێ تۆ

هەموو دەم وا لە گۆشەی بێ کەسیدا
بە شین و زاری و هاوارە بێ تۆ

ئەگەر فەرمووی چلۆن ماوی ئەوبەستێ
لە ئەم سەگ مەرگیە بێ عارە بێ تۆ

شەوی هیجران لەبەختی دڵ درێژە
کە ڕۆژی تالیشی تارە بێ تۆ

کە شادی دوژمن و غەم دۆستە قوربان
جەفا یارو سەفا ئەغیارە بێ تۆ

غەمی خۆی بەس بوو (صافی) وائەمێستێ
دڵی غەمباریشی سەربارە بێ تۆ

لەم ڕۆژە لەعەشقی یار سەودایی سەرێکم بوو

ئەمما بەسەبەب ئەغیار بۆ جان خەتەرێکم بوو

سەرمەشقی خەت و خاڵی ویردی دڵ و دینی من

بۆ ئایینی شەب خێزی ذکری سەحەرێکم بوو

لطفاً چ دەبی جانا لیمە ڕۆ کەنەوازیم کەی

دوو تێکە لەباخی ڕووت حصەی ثمەرێکم بوو

نەقدی ڕووحەکەم بۆ نارد کالانی وەفاکەی بێ

توحفێکی جەفاکەی هات هەر لا زەرەرێکم بوو

ئەی کاش شەوی هیجران بوو بە صباح الخیر

چونکی کەلەڕۆژی ڕووی مەیلی نەزەرێکم بوو

لەو پەرچەمی شێواوی داوی دڵی داناوە

بەو غەمزەیی دوو چاوی کونکون جیگەرێکم بوو

گوڵزارە لەگوڵزاری بۆ خونچە گوڵی زاری

گوڵ کەوتە شەکەرباری وا گوڵ شەکەرێکم بوو

نوختەی دەمی موهومە ئەو حیکمەتە مەکتومە

ئەغیار لەوە مەحرومە بەس مەن خەبەرێکم بوو

ڕووی شەمسی شهودمو خاڵ نوختێکی سوەیدایە

لەم دوو ئەثەرە (صافی) نوری بصرێکم بوو

ئەو پەرچەمو ئەگریجە هەموو دوژمنی دینە
ئەو زولفو رووە ئافەتی سەر رووی زەمینە

عەشقت لەدڵم نابتە ئەك عارزە قوربان
وەك نورەیی شاهان کە لەسەر رووی نگینە

عالەم چ دەزانی کە ئەمن کوشتەیی کێمە
لەو تیری موژەت زاهیرە دائیم کە بەخوێنە

بێ عارە دڵم چەندی جەفای دەی حەقە ئەما
جێی رەحمە گوڵم چونکی رەقیب وا لەکەمینە

دڵ بوویتە کەباب بۆ مەزەی دیدەیی مەستت
قوربان لەوە مطومە کە لێوت نمەکینە

جانا وەرە وا غەرقەیی تۆفانی سوروشکم
بۆ نوحی وەفات نابی ئەجاتم بە سەفینە

(صافی) کەلەخاکی دەری تۆ دوورە بەقوربان
سەگ مەرگی نەبێ هێندە چلۆن قابلی ژینە

جۆیباری چاوەکانم ڕووی زەمینی گرتووە
بۆبە سەحرای سینەکەم سەبزەی غەمی شین کردووە

ئەی ڕەفیقان مەنعی ناڵینم مەکەن بێ ئیختیار
حاڵەتێکە موبتەلایە دڵ لەدەستم دەرچووە

ناصحا وەعزی سەبووری هامەدە بێ فایدەیە
من لە مکتب خانەیی غەم دەرسی عەشقم خوێندوە

خۆت ئەگەر بێی بەکوژی خۆشە لەلام ئەمما رەقیب
وا دەڵێ مەحبوبە قەتلی تۆی بەگوێی من کردووە

هیچ کەسێ نایێ بەهاوارم لەلای ئەو عالەمە
والەبەر ناڵەو فوغانی من قیامەت ڕابووە
دەنەبێ بۆ سەر نەخۆشانت ئەگەر بێی ئەی طبیب
دەردە دارانت لە خۆشی تۆ شفایان هاتووە
عومرەکەم صرفی وەفات بوو مەرحەبایێکم نەدی
وا دەزانم رووحەم مەیلت لەسەر مـن لاچووە
دوور لەبالای تۆ بینایيم کوێرە هەڵنابێ بەکەس
رۆژو شەو بێدارە چاوم وا مەزانە نوستووە

